كوماری عیراق
وەزارەتی رۆشنبیری و راگەیاندن
دەزگای رۆشنبیری و بلاوكردنەوەی كوردی
زنجیرەی ژمارە (١٤٧)

# رێزمانی راناوی لكاو

وریا عمر امین

بەشی كوردی ـ دانشگای بەغدا

# پێشەکی

هەندێ جار لەخوێنەران ئەبیستم کە بە ئاسانی لە هەندێ لە وتـارە زمانـەوانی یەکـانم ناگـەن .. هـەشـە ئـەڵێ هیچیـان لێ تێناگەم .. بۆ ئەمانە هەموو ئەڵێم :

نووسین دوو جۆرە ، ( گشتی ) و( تایبـەتی ) . گشتی یەکـە بۆی هەیە مختص ونا مختص تێ ی بگەن تایبەکی یەکە مختص نەبێ تێ ی ناگات ، تەنـانەت ئـەمیش بە پێ ی پلەو سـروشتی ( اختصاص ) ەکەی .

هەر نووسینێ .. سەر بە هە چ بابەتێك بێ گەر زۆربە توانی یان تێ ی بگەن ئەوە هێشتا لە قۆناغی ( سرد ) و( سطحیەت ) دەرباز نەبووەو خۆی بە پەیرەوێکی تایبەتی یەوەنە بەستۆتەوەونە چۆتە خانەی اختصاصی وردەوە .

زمـان گەر ئـاڵۆزترین دیـاردەی سروشت نـەبێ یەکێکـە لە ئاڵۆزترینەکانی . ڕێزمان وزانستی زمان هەوڵدانە بۆ لێکدانەوە و روون کردنەوەی ئەو سیستەمەی ئەم دیارە یەکجار ئاڵۆزەی پێ هەڵئەسووڕێ وکار ئەکات . مێژوویەکی درێژو پڕ کێشەی هەیە .. لەهەر چەرخەی چەن قوتابخانەو پەیرەوێکی شی کردنەوە لە ئارادا بـووە ، هەر یـەکە فـەلسەفـە و ئامـانج وفـەرهەنگی زاراوەی تایبەتی ی خۆی هەیەو بەری کێشەی نێوان ئەوانی پێشوویەتی . هەمووش یەك ئەگرنەوە لەوەی ئەیانەوێ زمان پێ بناسێنن و ڕێگا بۆ ئەنجامی باشتر پاك کەنەوە . ئەنجام تیشك خرایـەسەر زۆر

لایەنی تاریك وشاراوەی ئەم دیاردەیەو زۆر گیروگرفتی تر سەری هەڵدا وتەکنیکی گشتی وەدی هینرا بۆ شی کردنەوەی زمان شان بەشان تەکنیکی تایبەت بە قوتابخانەکان خۆیان . جا کەی زمانێ لەژێر تیشکی ئەم دەسکەوتانە شیکرایەوە ئەوەی ( بەراستی ) لەمەیدانا نەبی بە ئاسانی تێ ی ناگات . ( وەك هەر لقێکی تری زانست ) .

هەر کەسێ شتێ لەبارەی پێناسینە لەقەکانی رێزمانی تەقلیدی ( بکەر ـ بەرکار ـ وشەـ پاشبگر ... هتد ) بزانێ ، ئەتوانێ بڵێ فلانە رستە لە فلانە وشەو بکەرو بەرکار ... هتد پێك هاتووەو فلانە وشە لەفلانە رەگ وپێشگرو پاشگر پێك هاتووە .. بەلام گەر لەژێر تیشکی دەسکەوتەکانی مەیدانی زانستی زمانی تازە وکێشەی نێوان قوتابخانەکان سەیری ئەم پێناسین وجۆرە شی کردنەوەیە بکرێ .. دەرئەکەوێ کە کار لەکار ترازاوە .

ساڵی ۱۹۷٥ بوو جارێ خەریکی شی کردنەوەی هەندێ رستەی کوردی بووم ، دووچاری دیاردەییکی سەیر هاتم زۆری سەرنج راکێشام ئەوەش ئەوە بوو لە هەندێ حاڵە تا بـە گۆرینی کـاتی فرمانی رستە دەوری هەندێ لە بەشەکانی رستـەکە ئـاڵ و گۆر ئەبوو . وەك لە :

## گوڵت بۆ ئە( نێر ) م

لەم رستەیەدا ( ت ) دەوری بەرکاری ناراستەوخـۆ و( م ) دەوری بکـەر ی ی بینیـووە ، ( نـێر ) رەگی کـاتی داهـاتـووی ( ناردن )٥ . کاتی رەگەکە بگۆرێت وبکرێت بـە رابردوو ( ت ) و( م ) دەورەکانیان ئاڵ وگۆر ئەکەن :

# گولت بۆ ئه( نلرد ) م

لەم رستەیە ( ت ) بکەرە و ( م ) بەرکاری ناراستەوخۆیە . نە هاتە بیرم ریزمانی کوردی ئەم لایەنەی چارەسەر کردبێ . وابوو نامیلکەیێکم [1] بە زمانی ئینگلیزی بلاوکردەوە ئەم دیاردەیەم تیا بەکورتی پێشکەش کرد .

ئەم باسەی بەردەستت هەولدانە بۆ روون کردنەوەی ئەم دیاردەیە . وەبختی خۆی بلاو کراوەتەوە [2] . لەبەر گرنگیی بابەتەکەو کەمیی سەرچاوە دەربارەی وا وەك کیتێبێکی سەربەخۆ بەتەختی دەسکاری‌یەوە پێشکەشی ئەکەمەوە بۆ سوودی قوتابی‌یانی بەشی کوردیو ئەوانەی بە تەنگ زمانەوانی‌ـ یەوەن .

باسەکە نەمێژوویی‌یە نە بەراووردی .. تەنیا لەو بەشەی راناوە لکاوەکان ئەکۆلێتەوە کە کاتی فرمان دەورەکانیان دەست

---

1— Amin. W.O. (1976) "Some fundamental rules of Kurdish syntax structure" London

لە کتێبخانەی نیشتمانی بە پێی نامەیان ژمارە ( ٩٩٩ ) مێژروو ( ٩ ـ ٥ ـ ١٩٧٧ ) تۆمار کراوە

٢ ـ وریا عمر أمین ( ١٩٨٣ ) ریزمانی راناوی لکاو . گۆڤاری کاروان ژ ٨ ل ٦٨ ـ ٧٤

نیشان ئەکات بەپێی پـەیرەوی گـوێزانـەوە Transformational Grammar . هەر کارێکیش هەر چەن بێ پلەی رەسەنایەتی ، تەواوکەری ئەوانی پێشوویەتی و هەنگاوێکە لەرێگایەکی بێ بندا .
سوپاس .

وریا عمر امین
بەغا ١٩٨٦

١ ـ ئه ـ تان ـ نێر ـ ین

بەرکار　　بکەر



٢ ـ ئه ـ تان ـ نارد ـ ین

ئەم دوو ڕستەیە لە قاڵبی ووشەیەکدا داڕێژراوان هـەردوو بریتین لە ( بکەر ) و( بەرکار ) و( فرمان ) بکەرو بەرکار تیایانا بە ڕاناوی لکاو دەربڕاون .

ڕستەی یەکەم ـ کاتەکەی داهاتووە

ڕستەی دووەم ـ کاتەکەی ڕابردووە

ئەوەی سەرنج ڕائەکێشێ ئـەوەیە گـۆڕینی کاتی فـرمانـەکە دەوری ( بکەر ) و( بەرکار ) ی ئاڵو گۆڕکرد .

ئەم باسە هەوڵدانە بۆ ڕوون کردنەوەی ئەم دیاردەیەی زمانی کوردی وداڕشتنی ڕێزمانەکەی .

لەزمانی کوردی ( خواروو ) بکەر وفرمان لە کەس وژمارەدا ڕێك ئەکەون.[1] واتا بکەر لە چ کەس و ژمارەیەکـدا بێت ، فـرمانیش ڕانـاوێکی لکاوی سـەر بـە هـەمـان کـەس وژمـارە وەرئەگرێت . بۆ ڕوون کردنەوەی ئەم لایەنە ئەبی ڕاناوە جوداو لکاوەکان بەپێی کەس و ژمارە لەبەر چاوا بن .

| ژمارە | کەس | جودا | لكاو | | |
|---|---|---|---|---|---|
| | | | ١ | ٢ | ٣ |
| تاك | ١ | من | م | م | م |
| | ٢ | تۆ | ت | یت | یت |
| | ٣ | ئەو | ی | - | ات/ێت |
| کۆ | ١ | ئێمە | مان | ین | ین |
| | ٢ | ئێوە | تان | ن | ن |
| | ٣ | ئەوان | یان | ن | ن |

وێنـەژمارە (1)

هەر چەندە جیاوازیی نێوان کۆمەڵی (2)و(3) تەنیـا لە کەسی سێیـەمی تاکدایـە . بـۆ مـەبـەستی شی کـردنـەوە جیـایـان ئەکەینەوە.(2)

جۆرو کاتی فرمان دەور ئەگێرن لە هەڵبژاردنی ڕاناوی لکاو .
( مەبەست لە جۆری فرمان تێپەڕ یاتێنەپەڕە ، مەبەستیش لەکاتی فرمان ، ڕابردوو یا داهاتوو .)

چۆنیەتی دەرکەوتنی ڕاناوی لکاو لە گەڵ فرمانا بۆ دەربڕینی ڕێکەوتن لەم وێنەیەدا ڕوون کراوەتەوە.(3)




وێنە ژمارە (2)

**واتا ـ گەر فرمانەکە لە ڕابردووی تێپەڕدا بوو کۆمەڵی یەکەم وەرئەگرێ .**



گەر فرمانەکە لە ڕابردووی تێنەپەڕ دا بوو ، بۆ دەربڕینی ڕێکەوتن لەگەڵ بکەرا کۆمەڵی دووەم وەرئەگرێ .




گەر فرمانەکە لەکاتی داهاتوودا بوو .. چ تێپەڕ بێ چ تێنەپەڕ بۆ دەربڕینی ڕێکەوتن لە گەڵ بکەرا کۆمەڵی سێیەمی لەگەڵا دەرئەکەوی .



بۆ هەڵبژاردنی ڕاناوی لکاو بۆ دەربڕینی ڕێکەوتن ، یەکەم - سەیری وێنە ژمارە (2) ئەکەین بە پێی کاتو جۆری فرمانەکە کۆمەڵەکە دەس نیشان ئەکەین ئنجا بە پێی کەسو ژمارەی بکەرەکە ، بە یارمەتی ی وینە ژمارە (1) ڕاناوە لکاوەکە ئەدۆزینەوە بۆ نموونە لە :

**ئیمە نارد -**

( نارد ) کە ڕەگی فرمانە ، لە ڕووی جۆرەوە ( تیپەڕە ) ولە ڕووی کاتەوە ( ڕابردووە ) . بە پێی وێنە ژمارە (2) ڕاناوی لکاو ئەبێ لەکۆمەڵی یەکەمەوە وەرگیرێ . (ئیمە ) کە بکەرە لە کەسی ( یەکەمی کۆ ) دایە . بەرامبەرەکەی بەپێی وینەژمارە (1) ، ( مان )ە . بەرەگی فرمانەکەوە ئەلکێنرێ و ڕستەکە ئەبێ بە :

**ئیمە نارد - مان .**

**هەروا لە :**

**ئەوان ئەنوو -**

( نوو ) ڕەگی داهاتووی ( نووستن )ە . لە ڕووی جۆرەوە ( تینەپەڕە ) ، لە ڕووی کاتەوە ( داهاتووە ) بە هۆی وێنە ژمارە (2) ڕاناوی لکاو ئەبێ لە کۆمەڵی ( سێیەم) وەربگیرێ . ( ئەوان ) کە بکەرە لە کەسی ( سێیەمی کۆ ) دایە ، بە پێی وینە ژمارە (1) بەرامبەرەکەی ( ن )ە . ڕستەکە ئەبێ بە :

**ئەوان ئەنوو - ن**

یەكێ لە تایبەتی یەتەكانی كۆمەڵی یەكەمی ڕاناوە لكاوەكان ـ واتا كۆمەڵی ( م ـ ت ـ ی ـ مان ـ تان ـ یان ) ئەوەیە شوێنیان لە ڕستەدا ئەگۆڕێ بە پێی قالبی ڕستەكە .

ئەگەر ڕستەكەبەركاری ڕاستەوخۆی هەبوو ڕاناوی لكاو بەمەوە ئەلكێ وەك لە :

**ئێمە گوڵ ـ مان بۆ ئێوە ئەنارد .**

كەی بەركاری ڕاستەوخۆ لە ڕستە كەدا نەبوو ، بە بەركاری ناڕاستەوخۆوە دەلكێ .

**ئێمە بۆ ئازاد ـ مان ئەنارد**

كەی ڕستە بەركاری ناڕاستەوخۆشی نەبوو ، پێشبەند ئەبێ بەپەناگەی .

**ئێمە بۆ ـ مان ئەنارد .**

بە لابردنی پێشبەند پێشگر ئەبێ بە پەناگەی :

**ئێمەئە ـ مان ـ نارد .**

كەی پێشگریش نەبوو ، ئەوسا پەڕەگی فرمانەوە ئەلكێ .

**ئێمەنارد ـ مان**

بە كورتی ( كۆمەڵی یەكەمی ڕاناوە لكاوەكان بە یەكەمی ئەم بەشانەی ڕستەوە ئەلكێ بەم ریزە :

[ ١ ـ بەركاری ڕاستەوخۆ (4)

٢ ـ بەركاری ناڕاستەوخۆ

٣ ـ پێشبەند

٤ ـ پێشگری یەكەم

٥ ـ ڕەگی فرمان ] ..... یاسا ژمارە ( ١ )

[ کۆمەڵی دووەم وسێیەم هەمیشە بەرەگی فرمانەوە ئەلکێن ] ...... یاسا ژمارە( ٢ )

جگـه له دەوری ( بكـەری ) ئـەم ڕانـاوە لكـاوانـە دەوری ( بەركاری ) ش ئەبینن . بەركـاری ڕاستەوخـۆو ناڕاستـەوخۆ و( ناوی خاوەن ) ئەشێ بە ڕاناوێكی لكاو جێگیر بكرێن .

لەبەر ئەوەی باس باسی دەوری بەركاری‌یە بۆیـە تەنیـا ئەو ڕستانە ئەگرێتەوە كەفرمانەكانیان تێپەڕە .

وەك لە سـەرەوە ڕوون كرایـەوە ، كۆمـەڵی یەكـەم لە گـەڵ ڕابردووی تێپەڕو كۆمەڵی سێیەم لەگەڵ داها تووی تێپەڕا دەوری بكەری ئەبینن . كۆمەڵی دووەمو سێیەمیش وەك یەكن تـەنیا لە كەسی سێیەمی تاكدا نەبێ .

بۆ دەوری بەركاری ڕاناوە لكاوەكان دابەش ئەكەینە كۆمەڵی (A) و (B) بەم جۆرە .

| A | B | |
|---|---|---|
| ١ | ٢ | ٣ |
| م | م | م |
| ت | یت | یت |
| ی | ـــ | ات/ێت |
| مان | ین | ین |
| تان | ن | ن |
| یان | ن | ن |

وێنە ژمارە ـ ٣ ـ

کۆمەڵی (A) کە دەوری ( بکەری ) لە ڕابردوودا ئەبینێ ...
دەوری ( بەرکاری ) لە داهاتوودا ئەبینێ .
کومەڵی (B) کەدەوری ( بکەری ) لە داهاتوودا ئەبینێ
دەوری ( بەرکاری ) لە رابردوودا ئەبینێ .
دەرکەوتنی ڕاناوە لکاوەکان بۆ دەوری ( بکەری ) و ( بەرکاری ) لە گەل فرمانی تێپەڕا لەم وێنەیەدا ڕوون کراوەتەوە[٤] .




بۆ جێگیر کردنی بەرکاری راستەوخۆ یاناڕاستەوخۆ یا ناوی خاوەن بە ڕاناوێکی لکاو ئەم هەنگاوانە ئەگرینە بەر :

١ ـ سەیری راناوە لکاوەکە ئەکەین کە دەوری بکەری ی بینیووە لە کامە کۆمەڵە ، بۆ بەرکاری ڕوو لە کۆمەڵە کەی تر ئەکەین . واتا ـ گەرلە کومەڵی (A) بوو روو لە (B) ئەکەین وبە پێچەوانەوە .

٢ ـ بە پێ ی کەسو وژمارەی ئەو بەشەی جێگیر ئەکرێ ـ بەیارمەتی وینە ژمارە ( ١ ) ، ڕاناوێکی لکاو هەڵئەبژێررێ .

٣ ـ بە پێ ی یاسا ژمارە ( ١ ) و( ٢ ) شوێنی ڕاناوەکە لەرستەکەدا دەس نیشان ئەکرێ .

بو نموونە لە ڕستەی :

ئیمە تۆ بۆ ئەو ئەنێرین .

بەرکاری ڕاستەوخۆ ( تۆ ) یا ناراستەوخۆ ( ئەو ) یاهەر دووکیان بەیەکەوە ئەشێ بەڕاناوی لکاو جیگیر بکرێن .

١ ـ ئەو ڕاناوە لکاوەی دەوری ڕیکەوتن واتا ( بکەری ) ی بینیووە ( ین ) لە کۆمەلی (B) یەوەیە . واتا ـ بۆ بەرکاری ڕوو لەکۆمەلی (A) ئەکەین .

٢ ـ ( تۆ ) کە لە کەسی دووەمی تاکدایە ( ٢ ت ) بە پێی وێنە ژمارە ( ١ ) لە کۆمەلی یەکەمدا بەرامبەرەکەی ( ت ) یە . ئەم ( ت ) شوێنی ( تۆ ) ئەگرێ .

٣ ـ بەپێی یاسازمارە ( ١ ) ، ( ت ) کە لە کۆمەلی یەکەمەوەیە ، دوای لابردنی بەرکاری ڕاستەوخۆ بە بەرکاری ناڕاستەوخۆوە ئەلکێ . بەم جۆرە ڕستەکە ئاوای لێ دێ .




ئیمە بۆ ئەو ـ ت ئەنێرین .

که بەرکارە ناڕاستەوخۆکە بە ڕاناوێکی لکاو جێگیر ئەکرێ :




ئێمە تۆ ـ ی بۆ ئەنێرین .

**گەر فرمانی ڕستەکە کاتەکەی ڕابردوو بێ :**

١ ـ کە بەرکاری ڕاستەوخۆ بە ڕاناوێکی لکاو جێگیر ئەکرێت .




ئەوان بۆ تۆ ـ **یان** نارد ـ م

ب ـ کە بەرکاری ناڕاستەوخۆ بەراناوێکی لکاو دەربنەبڕی .

ئەوان من ـ **یان** بۆ تۆ نارد




ئەوان منیان بۆ نارد..**یت** .

بۆ جێگیر کردنی ناوی خاوەن بە راناوێکی لکاو سەیری ئەم ڕستەیە بکە :

**ئۆتۆمبیلەکەی منت فرۆشت .**

( من ) کە ناوی خاوەنە ئەشێ بە هەمان پەیڕەو بە راناوێکی لکاو جێگیر بکرێ .

١ ـ ئەو ڕاناوەی دەوری بکەرێی بینیوود ( ت ) لە کۆمەڵی (A) یەودیە ، چونکە فرمانەکە رابردووی تێپەڕە .

٢ ـ ناوی خاوەن ( من ) لە کەسی یەکەمی تاکدایە ، لە کۆمەڵی (B)ی بەرامبەردکەی ( م ) د

٣ ـ بـه پێ ی یاسـا ژماره (2) ، کـۆمه ڵی (١) و(2) ی ڕانـاوه لکاوه‌کان که ده‌کاته کۆمه‌ڵی (B) هه‌میشه به‌ڕه‌گی فرمانه وه ئه‌لکێن به‌م جۆره ڕسته‌که ئاوای لێ دێ .




( (ی) که ده‌وری به‌ستنی ناوی خاوه‌ن به به‌رکاری ڕاسته‌وخۆوه ئـه‌بینێ دوای لاچـوونی نـاوی خـاوه‌ن ده‌وره‌کـه‌ی نـامینێ و لائه‌چێ ) .

( گه‌ر به‌رکاری ناڕاسته وخۆ به‌راناوێکی لکاو جێگیر کـرا .. پێشبه‌ندی (به) ئه‌بێ‌به (پێ) و(له) ئه‌بی‌به( لێ )......]
**یاسا ژماره (3)**




ئیمە قسەکە ـ ت پێ ئەڵێین .




تۆ کتێبەکانت لێ وەرگرتن

بەرکاری ڕاستەوخۆو ناڕاستەوخۆ ئەشێ هەردووک پێکەوەبەراناوی لکاو جێگیر بکرێن .

١ ـ گەر فرمانەکە لە کاتی داهاتوودا بێ هەردوو ڕاناوە لکاوەکەبە پێشەندەوە ئەلکێن بەم جۆرە :

**پێشبەند ـ بەرکاری ڕاستەوخۆ ـ بەرکاری ناڕاستەوخۆ .**

یاسا ژمارە (4)




**ئێمە بۆ ـ ت ـ ی ئەنێرین .**

ب ـ گەر فرمانەکە لە کاتی ڕابردوودا بێ .. هەردوو ڕاناوە لکاوەکان بە رەگی فرمانەوە ئەلکێن بەم جۆرە .

**ڕەگی فرمان ـ بەرکاری ڕاستەوخۆ ـ بەرکاری ناڕاستەوخو**

یاسا ژمارە (5)




تۆ بۆت ناردـ ن ـ ین




من بۆ ـ م نارد ـ ن ـ یت

( جێگیر کردنی هــەردوو بەرکـار پێکەوە بــە ڕاناوی لکـاو لە قسەکردنا زۆرکەمە)

کەی دوو ڕاناوی لکاو بە یـەکەوە بـەرەگی فرمـانەوە لکـان یەکێکیان دەوری ( بکەری ) ی وئەویتر ( بەرکـاری )ربینی ریز بوونیان بەم جۆرە ئەبی .

**رەگی فرمان ـ بەرکار ـ بکەر**
یاساژ(6)




تەنیا گەر ( بکەر ) لە کەسی سێیەمی تاکدا بیت . لەم حاڵەتەدا ریزبوونیان بەم جۆرە ئەبێ .

**رەگی فرمان ـ بەرکار ـ بکەر** **یاساژ (7)**



به جێگیر کردنی بەرکاری ڕاستەوخـۆی ڕستە بـە پێی ئەو یاسایانەی پێشکـەش کران روون ئـەبێتەوە بـۆ و چۆن دەوری ( بکەر ) و ( بەرکار ) ئالوگۆڕ ئەبێ بە گۆڕینی کاتی فرمانەکە :




ئە ـ تان ـ نێر ـ ین




ئە ـ تان ـ نارد ـ ین

# پەراویزەکان

(1) بۆ چەمکی ریکەوتن لە زمانا سەیری ئەم ووتارەم بکە .
ریکەوتن لە زمانا ـ گۆڤاری رۆشنبیری نوێ ژ ٩١ اذار ١٩٨٢ . ل **16 ـ 19**

(2)ـ وەك دەرئەکەوێ راناوی لکاوی کەسی سێیەمی تاکی کۆمەلی سێیەم خۆی بە ( ات ) یا (ێت ) دەرئەخا . ئەگەر رەگی کاتی داهاتووی فرمانەکە بە ( ۆ ) یا ( ـە ) کۆتایی هاتبێ ئەوە راناوە لکاوەکە قالبی ( ات ) ئەگریتە خۆ ، دوای ئەوەی ( ۆ ) ئەبێ بە ( و ) ی کونسونانت و ( ـە ) ئەتوێتەوە .




**من ئەخۆم ← ئەو ئەخوات**
**من ئەکەم ← ئەو ئەکات**
لە هەموو حالەتێکی تردا راناوەکە خۆی بە ( ێت ) دەرئەخات .
**ئەو ئەمرێت**
**ئەو ئەچێت**
**ئەو ئەنووێت ... هتد**

(3) - ( ویستن ) ناوێزەیە بەر ئەم یاسایە ناکەوێ . بۆ دەربڕینی ڕێکەوتن لەگەڵ بکەرا لەرابردوو وداهاتوودا کۆمەڵی ( ١ ) وەرئەگرێ .

**رابردوو**

| | | |
|---|---|---|
| من | ویست | م |
| تۆ | | ت |
| ئەو | | ی |
| ئێمە | | مان |
| ئێوە | | تان |
| ئەوان | | یان |

**داهاتوو**

| | | | |
|---|---|---|---|
| من | ئە | م | ـەوێ |
| تۆ | | ت | |
| ئەو | | ی | |
| ئێمە | | مان | |
| ئێوە | | تان | |
| ئەوان | | یان | |

(4) یابە و وشانەی لە زانستی زمانا بە Quantifierناو ئەبرێن وەك ( زۆر ، کەم ، هەندێ ... هتد ) وە ك :

من زۆر ـ م قسە پێ ووت .

ئێمە هەندێك ـ مان دیاری بۆهێنا .

# زاراوەکان

| | |
|---|---|
| subject (doer) | بکەر |
| object | بەرکار |
| direct object | بەرکاری راستەوخۆ |
| indirect object | بەرکاری ناڕاستەوخۆ |
| suffix | پاشگر |
| prefix | پێشگر |
| preposition | پێشبەند |
| transitive | تێپەڕ |
| stem | رەگ |
| present | داهاتوو |
| past | رابردوو |
| verb | فرمان |
| singular | تاك ( ت ) |
| plural | کۆ ( ك ) |
| agreement. | رێکەوتن |
| pronoun | راناو |
| personal suffix | راناوی لکاو |
| intransitive | تێنەپەڕ |

# سەرچاوەکان

1- Amin, W.O. (1079) "Aspects of the verbal construction in Kurdish" London University.

2 .... (1976) Some fundamental rules of Kurdish syntax structure" London

3- Mackenzie, D.N (1961) "Kurdish dialect studies" London.

٤ ـ و. ع . ئـەمين ( ١٩٨١ ) رانـاو لە کـرمـانجی‌ی خـواروو رۆژنامەی هاوکاری ژ ( ٦١٦ ) و( ٦٣٧ ) .

٥ ـ کۆڕی زانیاری‌ی کـورد ( ١٩٧٦ ) ڕێزمـانی ئاخـاوتنی کوردی .

## لەوتار و لێکۆڵینەوە زمانەوانی یەکانی

## دانەر

| | گۆڤاری | ژمارە | |
|---|---|---|---|
| ١ ـ زانستی زمان چی یە | ڕۆشنبیری نوێ | ٨٨ | اب ـ ١٩٨١ |
| ٢ ـ ڕێکەوتن لە زمانا | = | ٩١ | اذار ـ ١٩٨٢ |
| ٣ ـ خزمایەتی لە زمانا | = | ٩٤ | تموز ـ ١٩٨٢ |
| ٤ ـ ڕستەی بکەر نادیار | = | ٩٥ | اب ـ ١٩٨٢ |
| ٥ ـ زمان وماتماتیك | = | ٩٧ | مایس ١٩٨٣ |
| ٦ ـ تێنەپەڕ فرمانێکی بکەر نادیارە | = | ١٠٨ | کانونی یەکەم ١٩٨٩ |
| ٧ ـ چەن باسایێکی مۆرفۆلۆجی ی داڕشتنی فرمان | = | ١٠٩ | اذار ١٩٨٦ |
| ٨ ـ پەیوەندی ی ڕاناو وفرمان لە کرمانجی ی ژووروودا . | کاروان | ٢ | تشرینی دووەم ١٩٨٢ |
| ٩ ـ فۆنۆلۆجی | = | ٢٠ | مایس ـ ١٩٨٤ |
| ١٠ ـ ئیملای کوردی وچەن تێبینی یەك | کوڕی زانیاری کورد | ٩ | ١٩٨٢ |
| ١١ ـ لایەنێکی جیاوازی | = | ١٠ | ١٩٨٣ |
| ١٢ ـ ووشە | نووسەری کورد | ٩ | تشرینی دووەم ١٩٨٢ |
| ١٣ ـ فۆنیمەکانی زمانی کوردی | = | ٨ | حزیران ١٩٨١ |
| ١٤ ـ لە ئەنجامەکانی زانستی زمانی تازە | = | ١ | خولی سێ یەم اذار ١٩٨٥ |
| ١٥ ـ ڕوون کردنەوەیێك | = | ٢ | اب ١٩٨٥ |
| ١٦ ـ کات ورەگی فرمان | ڕۆژی کوردستان | ٥٦ | شباط ١٩٨٤ |
| ١٧ ـ باسایێکی فۆنۆلۆجی | = | ٦٦ | اذار ١٩٨٤ |
| ١٨ ـ ئامرازەکانی بەستن | = | ٦٧ | حزیران ١٩٨٤ |
| ١٩ ـ ڕێزمان چی یە | = | | |
| ٢٠ ـ کەی ( ات ) وکەی (ێت ) | = | ٧٠ | ١٩٨٥ |

| | | |
|---|---|---|
| | رۆژنامەی | |
| ٢١ ـ راناو لە کرمانجی ی ژووروودا هاوکاری | | ٦١٥ ١٠ ـ ١٢ ـ ١٩٨١ |
| ٢٢ ـ راناو لە کرمانجی ی خواروودا | = | ٦١٦ ١٧ ـ ١٢ ـ ١٩٨١ |
| ٢٣ ـ دەوری بەرکاری ی راناوە لکاوەکان ـ ١ | = | ٦٣٤ ٢٩ ـ ٤ ـ ١٩٨٢ |
| ٢٤ ـ دەوری بەرکاری ی راناوە لکاوەکان ـ ٢ | = | ٦٣٥ |
| ٢٥ ـ ڕێزمانی کوردی بە کەرەستەی دیالێکتی کرمانجی وسۆرانی | = | ٧٦٨ ٢٠ ـ ١٢ ـ ١٩٨٤ |
| ٢٦ ـ ئەم هەموو زمانە بۆ | | ٧٨٨ ٩ ـ ٥ ـ ١٩٨٥ |
| ٢٨ ـ نەفی لە کوردی یا | رۆژنامەی عیراق | ٨٢٢٣٨ ـ ٦ ـ ١٩٨٣ |
| ٢٩ ـ ئەسپیرانتۆ | = | ٦٢٢٦٢ ـ ٧ ـ ١٩٨٣ |
| ٣٠ ـ وەرگێران | = | ٧٢٣١٣ ـ ٩ ـ ١٩٨٣ |
| ٣١ ـ ریزمانی گشتی | = | ١٢٤٣٣ ـ ٢ ـ ١٩٨٤ |
| ٣٢ ـ هەندێ لە نووسینە کۆنەکان | = | ١٥٢٤٤٥ ـ ٢ ـ ١٩٨٤ |
| ٣٣ ـ مۆرفیم | = | ١١٢٤٩٣ ـ ٤ ـ ١٩٨٤ |
| ٣٤ ـ تێپەڕو تێنەپەڕ | = | ٣٠٢٥٣٤ ـ ٥ ـ ١٩٨٤ |
| ٣٥ ـ زمانەوانی | = | ١٢٢٦٩٥ ـ ١٢ ـ ١٩٨٤ |
| ٣٦ ـ چەن زمان | = | ٢٣٢٧٣١ ـ ١ ـ ١٩٨٥ |
| ٣٧ ـ مردنی ووشە | گۆڤاری کاروان | ١٩٨٦ |

1- Amin, W.O. (1979) "Aspects of the verbal construction in Kurdish" London University.

2 .... (1976) Some fundamental rules of Kurdish syntax structure" London

الجمهورية العراقية
وزارة الثقافة والاعلام
دار الثقافة والنشر الكردية
التسلسل ( ١٤٧ )

# قواعد الضمير المتصل

وريا عمر امين

كلية التربية - جامعة بغداد

The Grammar of the Personal suffixes

by

Waria Omar Amin

رقم الايداع من المكتبة الوطنية/بغداد ١١٢٧ في ١٩٨٦

السعر ( ٣٠٠ ) فلس

طبعت بمطابع دار الجماهير
١٩٨٦